


# چرای ڕێگا

## پوختەیەک لە عەقیدەی ئەهلی ئیمان



نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبداللە کوردستانی

نوێکراوەتەوە لە بەرواری
٩ شوال ١٤٤١ ڕۆژی دوو شەممە

# چرای ڕێگا

## پوختەیەک لە عەقیدەی ئەهلی ئیمان

نوسینی

لێکۆڵەر ئەبی عبدالله کوردستانی

ئامادەکردنی

خادم الإسلام

١٤٤٠ کۆچی / ٢٠١٩ زاینی





# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

**الحمد لله وله الحمد فی الأولی وفی الآخره. الحمد لله الذی خلق السموات والأرض فی سته أيام ثم ٱستوی علی العرش الذي لا إلٰه إلا هو الله الواحد القهار.**

بەپێویستم زانی کورتەیەکی پووخت لەسەر عەقیدە و ئیمان لەڕێگەی تەفسیری قورئان بەقورئان بنوسم لەگەڵ بەکارهێنانی فەرموودەکانی صحیح "مسلم" و "بخاری". لەم زەمەنە زۆرینە وەک خۆی لەعەقیدە نەگەیشتوون، ئنجا تێنەگەیشتن لەواتای عەقیدە و ئیمان گەورەترین خەسارەتمەندییە بۆ مرۆڤ، چونکە تەنها یەک عەقیدەمان هەیە ئەویش عەقیدەی أهل السنه والجماعەیە.

بناغەی تێگەیشتن لەعەقیدە زۆر ئاسانتر و ڕوونترە لە ماسئیلی فیقهی تر، چونکە عەقیدە بەڵگەی یەکلاکەرەوەی قورئان و سونەتی لەسەرە و بڕاوەتەوە وەک ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾﴾ یان (من مات لا یشرک بالله شیئا دخل الجنه)، بەڵام لە





مسائیلی فیقهی دەیان کتێب و چەندان مەزهەب دروست بوونە هەریەکە و بەجورێک دایڕشتووە بەپێی فەهمی خۆی. بەڵام هەر چوار مەزهەبەکە کۆکن لەسەر مسائیلی عەقیدە، بەڵام جیاواز لەبارەی نوێژ و ڕۆژ و دەست نوێژەوە ئەم سێ بنچینەیی باسی دەکەم گەر لێی سەلامەت بیت براوەی گەرنا خسر الدنیا والآخرە والعیاذ بالله. داواکارم لە الله تعالی بمانخاتە سەر ڕێگای ڕاست.

## باسی یەکەم: ناسینی خۆت هەروەها ئامانج لە دروست بوونت چییە؟

لەسەرەتادا وەکو پێشەکیەکی بچووک یەکێک لە پایە هەرە گرنگ و هەستیار و گەورەکانی دینە و تێگەیشتنی دینە، ئەمیش (العقیدە) بیروباوەڕ لەسەرووی گرنگییەکەیەوە، کەچی لای زۆرینەی زۆری خەڵکی پشتگوێخراوە و وەلانراوە و نەزانراوە، هەروەها شتێکی بچووک و فرێدراوە بەداخەوە.

لەوانەیە ئێستا لەزۆرینەی زۆری خەڵک بپرسیت عەقیدە مانایی چی هەیە یان ئەوەتا نازانێت یان پێناسەیەکی سادەی بۆ دەکات. بەپوختی عەقیدە وەکو پایەکانی بینایەک وایە یان دیواری خانوو چەند گرنگە بۆ ڕاوەستانی خانوو ئەمەش ئاوایە.

واتە گەر پایەی دیوارەکە توندوتۆڵ و پتەوبوو، ئەوا خانوەکە یان بیناکە توند دەبێت و مقاومەی باران و گێژەڵوکە و بوومەلەرزە زیاتر دەگرێت. (وکذلك المؤمن) واتە ئیمانداریش ئاوایە تا عەقیدەیەکی پتەوی قورئان و سونەتی هەبێت زیاتر خۆڕاگرترە لە فیتنە و ئیبتلا و مصیبتەکانی زەمەن و دونیادا.

منداڵ بەرلەوەی قاچ یان پا بگرێت، گرنگترین شت بۆ پێیەکانیەتی گەر پێیەکانی توند و تۆڵ نەبن، ناتوانێت بڕوات و چالاک بێت یان گەر بڕوات بەڕێوە بەردەوام توشی بەربوونەوە دێت. ئەمانە نموونەن تا زیاتر تێبگەن، واتە عەقیدە بۆمان ئاوا گرنگە تاچەند باسی گرنگی بکەیت تەواو نابێت دواتر بۆتان ڕووندەبێتەوە چۆنە.

**یەکەم هەنگاو لەعەقیدە ناسینی خۆمانە:**

واتە من واباسی دەکەم بۆئەوەی سادەتر و چاکتربێت بإذن الله تعالی. ئێمە کێین؟! پرسیارە، لەوانەیە زۆرینە گاڵتەیان پێبێت لای هەمووان زانراوە مرۆڤین، بۆ؟! چونکە الله پێمان دەڵێت نەوەی (ئادەمین)، واتە لەنەوەی (جن) نین. بەڵام بۆچی دروست بووین، واتە دەمەوێت ئەم خاڵە باس بکەم. بۆچی دروست بووین؟

قال الله تعالی: ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ۝٥٦﴾ وقال الرحمن فی الأول سورة تبارکة: ﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ﴾.

ئەم دوو ئایەتە لەقورئاندا ئاماژەن بۆ (خلق) دروستکراو و دەتوانین لێرەوە ئامانجی دروست بوونمان بزانین و بزانین کێین. کەواتە هەموو کارێک ئامانجی هەیە گەر ئامانجت زانی کارەکە ئاسانتر دەبێت. لەئایەتی یەکەم کە زۆر باوە، الله پێمان دەفەرمووێت (ئێوە) لێرەدا گشتییە، {خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ}. تەنیا بۆ پەرستن دروست بووین. هەروەها دیاریش کراوە بۆمان کێ بپەرستین کە دواتر دێینە سەری کە باسی "الله" یە.

ئامانجی دروستبوونمان زانی تەنیا بۆ (پەرستن). دواتر ڕوونتر دەبێتەوە بۆمان پێمان دەفەرمووێت واتە ئایەتی دووەم {ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ}. ئاماژەیە بۆخۆی کەوا بۆچی مردن و ژیانی زیدوبوونەوەی دروستکردووە. بۆچی؟ {لِيَبْلُوَكُمْ} تاوەکو هەڵمان سەگێنێت و بزانێت. {أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ} کاممان کردەووەمان چاک و باش و ڕاسترە. لە ئایەتەکانی تر باسی کردووە ئەوانەی کردوەی چاک دەکەن چۆنە. قال الله تعالی: {مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ} کەواتە کارەچاکەکە تەنیا بۆخۆمانە و خۆمان سوودی

لێدەبینین، {وَمَنۡ أَسَآءَ فَعَلَيۡهَا} ئەوانەی کاریان خراپە بۆخۆیانە نەهامەتی و قوڕ بەسەرییەکە وەک و قال الرحمن في كتاب الكريم: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ٢٩﴾[١].

ئێستا خۆمان ناسی و تەنانەت ئامانجی خۆشمان زانی. دوای ناسین ئامانجەکە دیاریدەکەین، ئەمیش خواپەرستی "الله" پەرستییە. واتە زۆر گرنگە بزانین کێ دەپەرستین و ئەوەی دەیپەرستین چییە و کێیە؟

بإذن الله تعالى لە باسەکانی داهاتوودا زۆر بەوردی باسیان دەکەین. هەمووی لەڕێگەی کتاب الله و سنه نبينا ﷺ. بۆیە تکام وایە چۆن بەوردی بابەتی نیشانەکان دەخوێننەوە و گرنگی پێدەدەن زیاتر و زۆرتر گرنگی بەم باسە هەستیارە بدەن. هەمیشە ئەم دووعایە بکەن، (اللهم إني أسألک الهدى والتقى والمعافات والغنى). یەکێکە لەدووعاکانی رسول الله ﷺ کە ئیمامی (مسلم) ڕیوایەتی کردووە.

---

١ السورة الرعد: ٢٩

## باسی دووەم: ناسینی الله عزوجل

وەک بیرهێنانەوە لەباسی پێشوودا کورتەیەک لە ناسینی خۆمان، واتە ئامانج لە دروست بوونمان چییە و بۆچییە و دیاریکردنی ئامانج کە خۆی بینییەوە لە (پەرستن) ئەویش پەرستنی اللهیە بەتەنها. کەواتە لێرەدا تیشک دەخەینە سەر ئامانجەکە کە اللهیە. دەبێت بزانین (الله _خودا_ رب العالمین) کێیە، واتە زۆر گرنگە ناسینی وەکو خۆی. بإذن الله تعالی بەپێی ئایەت و بورهان وەڵامدەدەینەوە. لە سورەتی (طه) لە کۆتایی پەڕەی یەکەم و لەسەرەتای پەڕەی دووەم کاتێک "موسا" علیه السلام دەچێتە جانب (الطور) وادی (المقدس) وا دەزانێت ئاگرە کە لەچەندەها ئایەت باسەکەی هاتووە الله پێی دەفەرمووێت. قال الرحمن فی کتاب الکریم: ﴿إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ١٢﴾[١].

واتە "مووسا" علیه السلام بۆ یەکەم جارە، بۆیە الله وەسفی خۆی بۆ دەکات پێی دەڵێت من خوای تۆم.

دیقەت بدەن "مووسا" قسەی لەگەڵ الله کردووە. دەبینن لەسەرەتادا الله خودی خۆی پێناساندووە، دواتر لە ئایەتی دواتر

---

١ سورة طه: ١٢

جوان بۆی ڕووندەکاتەوە قال الله تعالی: ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ١٤﴾[١].

سەیربکەن ووردتر بۆی باسدەکات کە کێیە. پێی دەفەرمووێت ئەوە من "الله" خودا کە هیچ خودایەکی دیکە جگە لە من نییە، هەروەها تەنیا منیش بپەرستن و بەس. کەواتە ئێمەش ئەم تعریفەی پڕعیزەتی خۆی وەردەگرین (لا إله إلا الله) ئەمە گەورەترین تەعریفە. ئنجا لە چەندەها ئایەت لەقورئان پێناسەی خودی خۆی دەکات. وەک، قال الله تعالی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾[٢].

لەم ئایەتەشدا تەعریفی خۆی بۆخەڵک بەگشتی دەکات، ئەویش دەفەرمووێت ئێوە ئەوانی پێش ئێوەشی دروستکردووە، کەواتە خالقە. لەئایەتێکی تریشدا، قال الله: ﴿وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ١٢٩﴾ الله خاوەن عەرشە کە گەورەترین دروستکراو (مخلوق)ە عەرش، یان قال الله تعالی: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ﴾ واتە ئامانجەکەمان خوای خاوەن حەوت چینی ئاسمانە. واتە

١ سورة طه: ١٤
٢ سورة البقرة: ٢١




لەدوای عەرش حەوت چینەکەی ئاسمان یان قال الله تعالی: ﴿هُوَ ٱلَّذِی خَلَقَ لَكُم مَّا فِی ٱلۡأَرۡضِ جَمِیعًا﴾.

بێگومان دەیان و سەدان ئایەت لەقورئاندا هەن بۆ ناسینی (تعریف) الله تعالی لەلایەن خۆیەوە. بەڵام گرنگ حاڵیبوونە لەوەی ئامانجی گەورە و تاکی مرۆڤ یان خلق رب العرشه. بێگومان لە هەموو کارێک گەر ئامانجت لا ڕوون بوو ئەنجامدانی زۆر ئاسانترە وەک لەوەی ناڕوون بێت.

منیش دەمەوێت خاڵ بەخاڵ و ورد بەشێوەیەکی جیاواز باسی عەقیدە و ئیمانتان بۆ بکەم. زۆر گرنگە ناسینی الله تعالی بەم هەموو وەسفەی کە خودی خۆی تەعریفی خۆی پێکردووە دەبینین لەکۆتایی زۆرینەی زۆری ئایەتەکان وەسفی خۆی دەکات، وەک (إن الله غفور رحيم) یان (عزيز حكيم) یان (عليم و قدير) یان (شديد العقاب) یان (عزيز ذوانتقام) یان (واحد القهار).

لەباسی داهاتوو وردتر باسی دەکەین کە ئێمە چی شتێکمان لەسەرە و لەسەر اللەش چ شتێک.

## باسی سێیەم: یەکەم ئەمر و فەرمان لەلایەن اللەوە چییە بۆمان؟

لەم باسەدا دوای (خۆ ناسین و خودا ناسین)، دەبێت بچینە نێو ناوەڕۆکی باسەکە زۆر بەوردی و پوختی و سادەوە. چونکە پێویستە و گرنگ و زۆریش گرنگە لەسەرمان زانینیان. بۆیە بۆئەوەی شتەکان تێکەڵ نەبن و زانینیان ئاسان بێت دەیکەمە چەند قۆناغ و لقێک.

**باسی یەکەم:**

یەکەم فەرمان لەلایەن خودی اللەوە بۆ ئێمە، واتە بۆ خەلق چییە و چی بوو هەر لە "ئادەم" تاوەکو خاتەم و هەر لە "جان" تاوەکو خاتەمی جن؟ واتە بۆ ئینس و جن. یەکەم وشە بەکارهاتبێت سیغەی ئەمرە ئەویش (عیبادات_پەرستن) لێرەدا چەند بەڵگەیەک دەخەینەڕوو بۆ ئەم باسە.

لە یەکەم هەنگاو دەگەڕێینەوە بۆ پێش خەلق بوونمان بزانین چی شتێک کراوە و ئێمەش شاهیدیمان داوە. قال الله تعالی:

﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدْنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾[١].

---

١ سورة الأعراف: ١٧٢

الله لە نەوەکانی "ئادەم" واتە مرۆڤایەتی بەهەموومانەوە لەو کاتەوە لە نێو پشتی "ئادەم"دا بووین بەر لە خەلق، وەعد و پەیمانی لە ئێمە وەرگرتووە و شاهێدیشمان لەسەریداوە و وەعدەکەش ئەوەیە الله پێی وتووین: ئایا من خوا "الله"ی ئێوە نیم و تەنیا من نیم. ئێمەش وتوومانە بەڵێ. ئنجا شاهیدیشمان داوە، واتە ئێمە لەسەر تەوحید و عەقیدەوە لەنێو پشتی "ئادەم" بووینەتە شاهید کە الله خودامانە. هەروەها وەک قال الله تعالی لە سورەتی (البقره) لەسەرەتاکانەوە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ﴾ بۆ هەموو خەڵک فەرمانکراوە تەنیا الله بپەرستین.

هەروەها لەئایەتێکی دیدا کە زۆر باسکراوە. قال الله تعالی: ﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ٥٦﴾[١] ئنجا زاناکان لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێن {**لیعبدون**} واتە تەنها الله پەرستی واتە بەس الله بپەرستین ئەمەش فەرمانە.

هەروەها لەئایەتێکی تردا لە سورەتی (البقره)دا هاتووە لەبارەی (بنی ئیسرائیل) وقال الرحمن: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾ لەم ئایەتەدا بەڵێن وپەیمان وەرگیراوە لە

---

١ سورة الذاريات: ٥٦

نەوەکانی پێغەمبەر "یعقوب" علیه السلام (بنی ئیسرائیل) واتە نەوەکانی "یعقوب" بەڵێنەکەش فەرمانیان پێکراوە الله بپەرستن و بەس. لێرەش ئەم سیغە و ئەمرە دووبارەبووەتەوە. هەروەها لەسورەتی (الأنبیاء)یشدا، قال الله:﴿إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ ٩٢﴾[١].

لێرەشدا الله فەرمانمان پێ دەکات بیپەرستین، واتە (العبادات خالصن لله تعالی فاعبدون). هەروەها لەئایەتێکی تردا کە پێشتر باسمان کرد دوای ئەوەی "موسا" دەچێتە لای خودا و دوای ناساندنی خۆی فەرمان بە "موسا" علیه سلام دەکات بیپەرستێت. قال الله تعالی سورەتی (طه): ﴿إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي﴾ کەواتە یەکەم فەرمان دوای ناساندن لەلایەن اللهوە فەرمانکردنە بە پەرستنی بەتەنها. ئێستا بۆمان ڕوونبووەوە دوای ناسین ئێمە متەلزمین. کەواتە وا فەرمان جێ بەجێبکەین بەپەرستنی الله تعالی. لەم باسەدا تیشکم خستە سەر ئەو ئایەتانەی کە لەلایەن اللهوە بەڕاستەوخۆ ئەمرمان پێکراوە بەعیبادات. دواتر دێینە سەر باسی پێغەمبەرانیش لە عیبادات بزانین یەکەم وشەی ئەوانیش چیبووە لەم بارەیەوە.

١ سورة الأنبیاء: ٩٢

## باسی چوارەم: یەکەم دەعوەی (الرسل) پێغەمبەران بۆ قەومەکانیان چی بووە؟

درێژەی باسی سێیەم بەڵام ئەمجارە لەزمانی پێغەمبەرانەوە. لەباسی سێیەمدا باسی بەڵگەکانی قورئان لە یەکەم ئەمردا بۆمانکرا. لێرەدا دێمە سەر باسی هەمان ئەمر بەڵام لەزمانی پێغەمبەرانەوە. لەسەرەتادا گەورەترین ڕەحمەت و بەخشندەیی الله لەگەڵ بنی آدم ئەوەبووە سەرەڕای وەرگرتنی عەهد لێمان بەر لەدروست بوونمان وازی لێنەهێناوین. بەڵکو پەیامی خۆی لەڕێگەی پێغەمبەرانەوە بۆمان ناردوە. بۆنمونە، قال الله تعالى: ﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَايَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ٣٨﴾[1].

بەڵێ ئەم هودایەش لەڕێگای پێغەمبەران بۆمان هاتووە. هەر لە ئادەم تاوەکو خاتم الأنبياء سيد المرسلين محمد الأمين ﷺ. لێرەدا تیشک دەخەمە سەر یەکەم کار یان یەکەم وشەی هەموو پێغەمبەران عليهما السلام چی بووە؟ بۆنمونە هەر لە "نوح"ەوە تاوەکو ڕەسولی خۆمان؟

**وەڵام:** قال الله تعالى:

١. یەکەم دەعوەی "نووح" عليه سلام بۆ قەومەکەی

---
١ سورة البقرة: ٣٨

﴿وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ٢٥ أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ٢٦﴾[١].

تەوحید بۆ قەومەکەیەتی بەتەنها بڵێن (لا إلەإلا الله).

٢. هەورەها "هوود" علیه سلام، واتە قەومی "عاد."

﴿وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ٥٠﴾[٢].

یەکەم بانگەوازی پێغەمبەر هوود بۆ قەومەکەی بریتی بوو لە الله پەرستی و دوورکەوتنەوە لە شیرک واتە لا إله إلا الله.

٣. هەروەها "صالح" علیه سلام واتە قەومی "ثمود."

﴿۞وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمۡ صَٰلِحٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱسۡتَعۡمَرَكُمۡ فِيهَا فَٱسۡتَغۡفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٞ مُّجِيبٞ ٦١﴾[٣].

یەکەم دەعوە و بانگەواز بۆیان لا إله إلا الله بووە.

---

١ سورة هود: ٢٥-٢٦

٢ سورة هود: ٥٠

٣ سورة هود: ٦١

٤. هەروەها "شعيب" عليه سلام واتە قەومی"مدين."

﴿۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ وَلَا تَنقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ ۚ إِنِّي أَرَاكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾﴾[1].

یەکەم دەعوە و بانگەوازی شوعەیب پێیانی ووتووە بڵێن لا إله إلا الله.

٥. "إبراهيم" عليه السلام، یەکەم دەعوەی بۆ باوکی.

﴿يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾﴾[2].

پێچەوانەی الله پەرستی دەبێتە عیبادات بۆ شیطان، کەواتە پێی گوتوە لا إله إلا الله.

٦. "موسا" عليه سلام، یەکەم دەعوەی بۆ لای فیرعەون.

قال الله تعالى: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰ يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾﴾[3]. بە فیرعەون دەڵێت من نێردراوی (رب العالمين)م واتە اللهی هەموو کەون، بۆیە فیرعەون بەسەر سوڕمانەوە بە موسا

---

١ سورة هود: ٨٤

٢ سورة مريم: ٤٤

٣ سورة الأعراف: ١٠٤

علیه سلام دەڵێت، قال الله تعالى: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾﴾[١] رب العالمين کێیە؟ چییە؟ چونکە دەعوەی موسا تەوحیدە، بۆیە فیرعەون پرسیاری لێکرد. وەڵامی موساش لە ئایەتی دواتری هەمان سورەتدا بۆی: ﴿قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٢٤﴾﴾[٢] بەڵێ بە فیرعەون دەڵێت خوای ئاسمانەکان و زەوییە، فیرعەون پێی سەرسوڕمان دەبێت و دەڵێت: ﴿قَالَ لِمَنْ حَوْلَهُۥٓ أَلَا تَسْتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾﴾[٣] لەوەڵامدا موسا علیه سلام زیاتر و وردتر بۆی ڕووندەکاتەوە دەڵێت: ﴿قَالَ رَبُّكُمْ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾﴾[٤] بۆیە فیرعەون دەڵێت: ﴿قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِىٓ أُرْسِلَ إِلَيْكُمْ لَمَجْنُونٌ ﴿٢٧﴾﴾[٥] فیرعەون دەڵێت ئەوەی بۆتان هاتووە شێتە؟ بۆچی؟ چونکە موسا علیه سلام دەعوەی تەوحیدی ئاڕاستەی فیرعەون کرد. بەڵێ ئەمیش پێی ڕاگەیاند لا إله إلا الله. بەهەمان شێوە دەعوەی سەرجەم پێغەمبەران تەوحید بووە، چونکە گەورەترین وشەی تەوحیدە. لا إله إلا الله سەخترین وشەیە بۆ سەر دڵی کافران و

---

١ سورة الشعراء: ٢٣

٢ سورة الشعراء: ٢٤

٣ سورة الشعراء: ٢٥

٤ سورة الشعراء: ٢٦

٥ سورة الشعراء: ٢٧

موشریکان و لەتەرازووشدا چاکترین و قورسترین وشەیە لای الله. قال رسول الله ﷺ: أفضل الذكر لا إله إلا الله.

چونکە تاکە وشەی تەوحیدە، واتە یەکەم دەعوەیان تایبەت بووە بە عەقیدەوە ئەویش تەنها الله پەرستی بەتەنهایە، واتە وشەی تەوحیدییەتە لە پەرستن. لە (صحيحين)دا هاتووە لە "إبن عباس"ەوە ڕەزاو ڕەحمەتی اللهی لێبێت، کاتێک وەفدی (ڕەبیعە) یان (قیس) دێن بۆلای پێغەمبەر ﷺ یەکەم ئەمر کە پێی دەڵێت: (إمان بالله وحده).

هەروەها لە قۆناغی مەککیدا هەموو دەعوەکەی لەم وشەدا بوو (لا اله الا الله)، واتە یەکخواپەرستی بەتەنها. لە کۆڵانەکان خەڵکی بانگ دەکرد ئەی خەڵکینە بڵێین "لا اله الا الله" براوەن. کەواتە ئێمەش مولزەم کراوین یەکەم هەنگا و دوای ئیمان هێنان عەقیدە و ئیمانێکی پاک و یەکخواپەرستیمان هەبێت. گەرنا هەرچەند عیبادات بکەین دەبێتە تۆزی بابردوو (هباء منثورا).

## باسی پێنجەم: پێناسەی "لا إله إلا الله" چییە؟ بۆچی دەڵێین گەورەترین وشەی تەوحید؟

لەم باسەدا پوختەی سەرجەم باسەکانی پێشووتر کورت دەکەینەوە بۆ تەنها یەک وشە، ئەویش (لا إله إلا الله) واتە هەموو مەبەستی چوار باسەکەی پێشووتر دەرئەنجامەکەی ئەم وشەیەی لێدەردەچێت. کەواتە دەبێت ئێمەش زۆر بەوردی لەسەری بدوێین و بزانین گرنگیەکەی چییە، ئنجا ماناکەی و پاشان مەرجەکانی. لەسەرەتادا ئێمە پێناسەی دەکەین چونکە لە هەموو وشە و بابەتێک پێناسەیەک هەیە.

**پێناسە(تعريف)ی لا اله الا الله:**

قال الله تعالی (سورة القصص): ﴿وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾.

لەم ئایەتەدا الله پێمان دەفەرمووێت کە ئەو تاکە اللهی کون جگە لەو هیچ خوایەکی تر وجودی نییە و نابێت، بۆیە لەئایەتێکی تر ڕوونتری دەکاتەوە بۆمان کە دەفەرمووێت، قال الله تعالی: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَٰهٞۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ ٨٤﴾[1].

١ سورة الزخرف: ٨٤

لەم ئایەتەدا الله وردتر بۆمان ڕووندەکاتەوە کە لە ئاسمانەکان و زەوی تاکە پەرستراو (إله)، وەک لە وشەی (لا إله) هیچ پەرستراو (إله)ێک نییە جگە لە الله بەحەق شایستەی پەرستن بێت الله تعالی (حکیم خبیر)ە، بڕاندوویەتیەوە بەوەی لە ئاسمان و زەوی دا (إله). بەڵێ هەرچی مەلائیکە و مەخلوقە لە ئاسمان دەیپەرستن و لە زەویشدا هەرچی دار و بەرد و چیا و هەموو شتێک دەیپەرستن و دەبێت مرۆڤیش بیپەرستێت.

### ئەم وشەیە لە دوو بەش پێکدێت:

**یەکەم: لا إله**

لێرەدا الله تعالی پێمان دەڵێت هیچ خودایەک نییە. واتە خالق تەنها یەکە و بێ شەریکە، پێشگر و پاشگرێک. دواتر باسی (إله)کان دەکەین کە چەند جۆرێک بۆ نمونە، هەیە دار دەپەرستێت هەیە کەسێک دەپەرستێت هەیە ڕۆژ ئا بەمشێوە تا دوایی. بۆیە لەسەرەتاکەی نەفی دەکەیت لەهەموو خودایەک.

**دووەم: إلا الله**

لێرەدا تەئکید و ئیثبات دەکەیتەوە خوداکانی تر باطلن و نین و تەنها الله هەیە و شایستەی پەرستن بێت بەحەق. واتە ئاگاداربن

ئەمە حەقی اللە، بۆیە دەبێت بڵێین (لامعبود بحق إلا الله)، واتە هیچ پەرستراوێکی بەحەق نییە جگە لە اللە.

با بزانین چۆن حەق، لە فەرموودەیەک کە لە (صحیحین)دا هاتووە و چەندان پێشەوای تر ڕیوایەتیان کردووە. کاتێک "معاذ بن الجبل" رضی الله عنه لە دوای پێغەمبەر ﷺ سواردەبێت، پێی دەفەرمووێت ئەی "معاذی بن جبل" ئەویش دەڵێت: لەخزمەتتام ئەی رسول الله سێ جار ئاوا بانگی دەکات. ئنجا پێی دەڵێت، ئایا دەزانی حەق یان مافی اللە چییە بەسەر بەندەکانی ئەویش دەڵێت اللە و رسولەکەی زاناترن. دەفەرمووێت حەقی اللە بەسەربەندەکانی ئەوەیە *بیپەرستن* و (شرک) *هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەن*. دواتر دەڵێت حەقی بەندەکانیش بەسەریەوە ئەوەیە کەوا نایانکاتە ناو ئاگرەوە.

لەم فەرموودەیەدا (حق الله علی العباد) دیاریکراوە. بۆیە پەرستنی تەنها و یەکخواپەرستی حەقێکە تایبەت بەخۆیەتی. بۆیە دەبینین ئەم وشە دەبێتە بناغەی دین و ئیمان، (لا إله الا الله) واتە عەقیدە و ئیمان. لەکورترین پێناسەدا. ئێمە لەچەندەها فەرموودەی ڕاست و دروست خوێندومانەتەوە کەوا لەکۆتاییدا واتە ئەهلی ئاگر کە اللە دەریان دەهێنێت. کە لە "مسلم" و

"بخاری"دا بەچەند شێوەیەکی جیاوازەوە هاتوون. بۆنمونە، (یخرج من النار من قال لا اله الا الله و فی قلبه مثقال ذرة من الإمان یان شعیر یان حبه من الامان).

کەواتە مەرجە ئەوانەی کە دەردەهێنرێن واتە (خلد)نین گوتبێیتیان (لا اله الا الله). بۆیە دەبینین ئەم وشە گەلێک گەورەیە، بەڵام بۆ زانیاریتان لە هەرشوێنێک لە نوسین یان لە هەرکاتێک هات، بەڵام واتە بەربەست یان مەرجت دێتە پێش. لێرەدا زاناکان چەندەها مەرجیان داناوە بۆ (لا إله إلا الله) کە هەندێک حەوتیان داناوە هەندێک دەیان داناوە.

لەصحیح "بخاری"دا هاتووە لە کتاب (العلم). ئیمام "ئەبو هریره" رضی الله عنه دەپرسێت لە پێغەمبەر ﷺ ، ئەی رسول الله کێ دڵخۆشترین یان خۆشبەخترین کەسە (یوم القیامه) لە ڕۆژی دواییدا. ئەویش دەفەرمووێت چاوەڕێم نەدەکرد جگە لە تۆ کەسی تر ئەم پرسیارەم لێبکات، بەهۆی سووربوونت لەفێربوونی فەرموودە. دەفەرمووێت (أسعد الناس) یەکێکە، (من قال لا إله إلا الله صادقا من قلبه). واتە ڕاستگۆ بێت لەدڵیەوە. ئەمەشیان یەکێکە لە مەرجەکانی (لا إله إلا الله) دواتر بە وردی دێینە سەرباسکردنی.

## باسی شەشەم: مەرجەکانی "لا إله إلا الله" یاخود مەرجەکانی تەوحید و یەکخواپەرستی لە قورئاندا

لەم باسەدا باسی ئەو مەرجانە دەکەم لەسەر مانایی (لا إله إلا الله). کە پێویستە لەسەر هەموو ئیماندارێک بیزانێت ئەم مەرجانەش وەک بناغە وان بۆ ناسینی ئەم مانایە. وەک زانرا کەوا (لا إله إلا الله) پەیامی هەموو پێغەمبەران بووە علیهم السلام. بەڵام دەبینین لای زۆرینەی موسڵمانان زۆر وەلانراوە و فەرامۆشکراوە. مەرجەکانیش بەکورتی تەنیا بۆ بیرهێنانەوە و زانین لای هەندێک.

**یەکەم: (العلم):** یەکەم مەرج دانرابێت بۆی زانست و زانیاری بەم وشە یان کەلیمەیە، وەک لەفەرموودەیەکدا هاتووە {العلم نور} (أربعین نووی). واتە گەر زانیاریت نەبێت نازانیت، (لامعبود) واتە هیچ پەرستراوێک نییە و نابێت "بالحق" واتە بەحقی خۆی، کەچی (إلا الله) جگە لەخوای گەورە هەموو باتڵە. وەک، قال الله تعالی في کتاب العزیز: ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ کەواتە گەر عیلمت نەبێت لەوانەیە شەریکی بۆ بڕیاربدەی یان وەکو خۆی نایناسی یان ناپەرستی. یان قال رسول الله ﷺ: (من مات وهو یعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة).

واتە هەرکەسێک بمرێت و بشزانێت (لا اله الا الله) واتە جگە لە الله هەموو باتڵن ئەوا دەچێتە بەهەشت.

**دووەم: (اليقين):** زۆر گرنگە بەیەقینەوە الله بپەرستی یان خواپەرستی بکەیت. چۆن؟

قال الله تعالى: ﴿إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ٩﴾[1].

بۆچی پێویستیان پێی نییە؟ چونکە یەقینیان هەیە کە دەڵێن ﴿إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ﴾ واتە یەقینیان بەپاداشت هەیە لەلایەن اللهوە، یان قال الله تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعۡبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرۡفٖۖ فَإِنۡ أَصَابَهُۥ خَيۡرٌ ٱطۡمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنۡ أَصَابَتۡهُ فِتۡنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡخُسۡرَانُ ٱلۡمُبِينُ ١١﴾[2].

موفەسیران وەک "امامی طبري" لەتەفسیری (على حرف)دا دەڵێت واتە (گومان یان شک). واتە یەقینیان لادروست نەبووە بەم عیباداتە، بۆچی؟ چونکە نە (عیلم)یان پێی هەبوو و نە (صادق) ڕاستگۆبوون. بۆیە لەگەڵ هەر فیتنە و تاقیکرنەوەیەکی سەخت هەڵدەگەڕێنەوە و واز دەهێنن. یان لەم فەرموودەیەدا

---

١ سورة الإنسان: ٩

٢ سورة الحج: ١١

هاتووه، حدیث أبي هریرة قال: قال رسول الله ﷺ : (أشهد ألا إله إلا الله وأني رسول الله، لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة).

سەیربکەن واتە شەهادەت بە یەقینەوە بهێنێت، ئیمان کامڵ نابێت تا بەیەقینەوە نەبێت، وەک قال الله تعالى: ﴿وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ ٩٩﴾.

**سێیەم: (القبول):** واتە قبوڵی بکەیت ئەم وشە چۆن کە بڵێیت هیچ پەرستراوێک نییە بەحەق شایستەی پەرستن بێت جگە لە الله.

دەبینین موشرکین و گەلانی پێشوو کاتێک داوای ئەم وشەیان لێکراوە لایان زۆر سەخت و قورس و گران بوو، چۆن؟ دەیان ووت، قال الله في كتاب الكريم: ﴿وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ٣٦﴾[١].

واتە هەرگیز باو و باپیرانمان شتێکی وایان نەوتووە و گوێشمان لێیان نەبووە.

---

١ سورة القصص: ٣٦

یان قال الله تعالى: ﴿إِنَّهُمۡ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسۡتَكۡبِرُونَ ٣٥﴾ واتە زۆر کیبر و خۆبەزلزانبوون دەیان ووت: ﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٖ مَّجۡنُونِۢ ٣٦﴾ بەم لەفزە یەعنی ئێمە واز لە خواکانمان بهێنین بۆ شاعیرێکی شێت، حاشا لە مقامی. یان دەیان ووت، قال الله تعالى: ﴿أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ ٥﴾ واتە بە سەر سوورِمانەوە دەیان ووت ئێمە تەنها یەکخواپەرست بین. واتە قبوولیان نەبوو بڵێن (لا إله إلا الله). بۆیە قال الله تعالى: ﴿خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ بەڵێ زۆر گرنگە ئێمە شارەزابین لەم عەقیدەیە، چونکە بناغەیە ئەگەر نەتبێت دەڕوخێت.

**چوارەم: (الإنقياد):** مەرجی چوارەم کەوا دانراوە بۆ ئەم وشە. بەعەمەلی، واتە (الإنقياد لە بالطاعة) واتە عیبادەت بۆی هەبێت بۆنمونە قال الله تعالى: ﴿۞وَمَن يُسۡلِمۡ وَجۡهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰۗ﴾ واتە دەست گرتوو بەم ئەسبابی ئیمانە و هەروەها دوای خۆ تەسلیم کردن بۆ الله، ئنجا ئەسبابی بگرێتەبەر.

**پێنجەم: ڕاستگۆبێت (الصدق):** واتە لەگەڵ وتنی ئەم وشەیەت ڕاستگۆ دەرچێت، چونکە قال الله تعالى فی کتاب

الكريم: ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَاهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ واتە بەدەم و قسە شتێک دەڵێن بەڵام لە دڵەوە وانین. یان قال الله تعالی: ﴿يَقُولُونَ بِأَلْسِنَتِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْ﴾ یان قال الله تعالی: ﴿أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢ وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ ۝٣﴾[1].

سەیربکەن واتە وازمان لێناهێنرێت کەوا بەدەم بڵێن (آمنا) نەخێر الله بەهەموو ڕێگایەک تاقیمان دەکاتەوە بۆچی؟

تاوەکو ڕاستگۆیمان دەربکەوێت والله المثل الأعلی، واتە چۆن بڵێین شتێک لە بێژینگ بدرێت چی تێدا دەمێنێتەوە، ئێمەش ئاواین واتە دەبێت ئیماندار بە عەمەلی بیسەلمێنێت کەوا ڕاستگۆیە لەگەڵ ئەم وشەیە. ئنجا رسول الله دەفەرموویت ئەی "معاذ" هەریەک ووتی (اشهد ان لا اله الا الله وان محمد رسول الله)، بەڕاستگۆیی لەدڵیەوەبێت دەچێتە بەهەشتەوە.

**شەشەم: (الإخلاص):** یەکێکە لەهەرە مەرجە گرنگەکان واتە بە تایبەت ئەم عیباداتە بۆ الله تعالی بێت. خوای گەورە لە قورئان لە چەندەها ئایەت تەئکید لەم عیباداتە دەکاتەوە بە

١ سورة العنكبوت: ٢-٣

ئیخلاصیەتەوە و لەم ڕۆژگارەدا خەڵکێکی زۆر لەم خاڵە تێکەتووە، بۆچی؟ چونکە عیباداتەکەی تەنها و تەنها بۆ اللهتعالی نییە. قال الله تعالی: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ﴾ وقال: ﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ١٤﴾.

بەڵێ ئیخلاصیەت واتە پەرستن و عیبادات بێ هیچ شیرک و تەوسیلێک. هەروەها پەرستن لە هەموو لایەنێک چۆن پەرستنی "الله" تاوەکو دوعا و پاڕانەوەکان و هەموو شتێک تایبەت بەعیبادات لە قوربانی و سەربڕینەکانی تایبەت بەعیبادات دوور لە هانا و هاوار بردن بۆ شێخ و قەبر و فڵان ئەوەتا ڕاستەوخۆ لە قورئان فەرمانمان پێ دەکات.

**حەوتەم: (المحبة):** خۆشەویستیت بۆی، قال الله تعالی: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ﴾ کەواتە مەرجی خۆشویستنی الله شوێنکەوتنی ئەم بەرنامە و ڕێبازەیە کە بۆی ناردووین کە ئیسلامە و خۆشویستنی رسولەکەی و شوێنکەوتنیەتی. هەروەها لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە، عن أنس قال: قال رسول الله ﷺ: (لا یؤمن أحدکم حتي أکون أحب إلیه من ولده ووالده والناس أجمعین).

واته باوەڕ و ئیمانی هیچ کەسێک تەواو نییە و نابێت هەتاوەکو منی خۆش تر نەوێت لەدایک و باوک و هەموو کەسێک.

وەک لەکاتی خوێندنەوەی فەرموودەکان دەبینین زۆرجار هاوەڵان ووتویانە (بأبی انت وامی) یان (فیداك). ئەگەر بێتو لەگەڵ هەر مەرجێک باسی بکەین چەندەها باسی تری دەوێت، بەڵام ئەوە تەنها بۆ زانین و بیرخستنەوەیە. دڵنیاش بن  مەرج و کلیلی چوونە بەهەشت ئەمەیە.

## باسی حەوتەم: ئایا ڕاستە هەرکەسێك بڵێت "لا إله إلا الله" دەچێتە بەهەشتەوە تەنها بەوتنێکی سەرزارەکی (قولا) بەبێ کارپێکردنی (عملا)؟

لەم باسەدا بەپووختی و کورتی باسی ئەوە دەکەین گەر یەکێک بڵێت (لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشت یان ئەم مەرجانە دەبێت تێیدابێت. چەندین فەرموودە هەر لە (صحیحین) و لە (مسند) و (مصنف)ەکانیش داهاتووە ئەگەر یەکێک بڵێت (لا إله إلا الله) دەچێتە بەهەشت وەک ئەم فەرموودانانە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، قَالَ : قُلْتُ لِلنَّبِيِّ ﷺ : مَنْ أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِكَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: (لَقَدْ ظَنَنْتُ يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَلَّا يَسْأَلَنِى عَنْ هَذَا الْحَدِيثِ أَحَدٌ أَوَّلَ مِنْكَ لِمَا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْحَدِيثِ، أَسْعَدُ النَّاسِ بِشَفَاعَتِى يَوْمَ الْقِيَامَةِ مَنْ قَالَ : لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ خَالِصَةً مِنْ قِبَلِ نَفْسِهِ)[١].

أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّهُ قَالَ : يَا رَسُولَ اللَّهِ، مَاذَا رَدَّ إِلَيْكَ رَبُّكَ عَزَّ وَجَلَّ فِي الشَّفَاعَةِ؟ قَالَ : (لَقَدْ ظَنَنْتُ لَتَكُونَنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَنِي مِمَّا رَأَيْتُ مِنْ حِرْصِكَ عَلَى الْعِلْمِ، شَفَاعَتِي لِمَنْ يَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصًا، يُصَدِّقُ قَلْبُهُ لِسَانَهُ، وَلِسَانُهُ قَلْبَهُ)[٢].

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (عَمِّ، قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ)[٣].

عن عِتْبَانَ بن مالكٍ رضي الله عنه (فَإِنَّ اللَّه قَدْ حَرَّمَ عَلَى النَّارِ مَنْ قَالَ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّه يَبْتَغى بِذَلِكَ وَجْهِ اللَّه).

---

١ مسند امام أحمد، حديث صحيح

٢ صحيح مسلم، كتاب إمان.

٣ صحيح بخارى

لەم فەرموودانەدا کە لەچەند ئیمامێکەوە و بەچەند شێوەیەکی جیاواز هاتوون باس لە گرنگی (لا إله إلا الله) دەکاتن. بەڵام ئەوەی گرنگ بێت بۆتان ڕوونبکەمەوە یان وەک بیرهێنانەوەیەک ئەوەیە لەهەموو ئەم فەرموودە (محکم)انەی لەسەر ئەم ووشە هاتوون لەکۆتاییدا واتە لەکۆتا خاڵی فەرموودەکەدا مەرج دانراوە. وەک لەیەکەم فەرموودەدا مەرجە ئەوەی دەڵێت من قال: (لا إله إلا الله "خالصا")

واتە یەکێکە لەمەرجە گرنگەکان کەوا تەنیا و تەنیا (قول) قسە و (عمل) کردگارن تا بیسەلمێنێت بۆ (الله) تعالی یە و لە دووەم بەهەمان شێوە کەوا لەدڵەوە ڕاستگۆبێت. هەروەها زارەکی نییە، هەریەک بڵێت (لا إله إلا الله) بچێتە بەهەشت، نەخێر هەرگیز ناچێتە بەهەشت گەر ئەم مەرجانەی تێدانەبێت کەباسکراون، والله أعلم. یان لە فەرمودەی "عتبان بن مالک" کە دوور و درێژە من تەنیا ئەم باسەم لێ دەرهێناوە. لێرەدا رسول الله ﷺ دەڵێت، جەهەنەم حەرام کراوە لەسەر ئەو کەسەی بڵێت (لا إله إلا الله)، بەڵام ئامانجی ڕەزامەندی الله تعالی بێت و دوور لە نیفاق بێت، چونکە ئەم فەرموودە لەکاتێکدا بوو کە هاوەڵەکان ووتیان "مالک بن دخشن" مونافقە. ئەویش پێی فەرموون (ألا ترون یقول لا إله

الا الله) واتە ئایا نابینن کەوا دەڵێت (لا إله الا الله)، بۆچی؟ چونکە مونافیقەکان دەیانووت: (أشهد أنک رسول الله). هەروەها الله تعالی لە سورەتی (المنافقون) ئایەتی یەکەم وەڵامی دانەوە و فەرمووی، قال تعالی: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلْمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١﴾.

کەواتە دەبینین مونافق دەڵێت (أشهد أن لا اله الا الله وان محمد رسول الله) بەڵام خوای تعالی پێیانی فەرمووە درۆ دەکەن، بۆچی؟ چونکە (عمل) کردگاریان پێ نییە بەڕاستی و (قول) بەقسە وا دەڵێن، بەڵام لە (عمل) کردەوەدا پێچەوانەن و ڕاستگۆ نین لەگەڵ ئەم ووشەیەدا و موحبەتیشیان نییە، چونکە ئەگەر خۆشەویستیان بۆ ئەم شهادەتە هەبێت وایان نەدەکرد. بۆیە ووتنی (لا اله الا الله) تەنیا قەول واتە قسەبێت، بەڵام (عمل) کردەوەت پێی نەکردبێت. نەخێر، هەرگیز سوودت پێناگات.

لەکۆتاییدا تاکە بەڵگە یان حوججەی مرۆڤ لەقیامەت ئەم ووشەیەیە بەهەموو مەرجەکانیەوە وەک لەم فەرموودە.

فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (ﷺ): (يَا عَمِّ، قُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، كَلِمَةً أَشْهَدُ لَكَ بِهَا عِنْدَ اللَّهِ)[١].

لێرەدا رسول الله بە مامی (ئەبو تاڵیب) دەڵێت تەنیا بڵێ (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ) تاوەکو ببێتە شاهێد و بەڵگە و حوججەیەک بۆت لای الله.

## باسی هەشتەم: طاغوت چییە و کێیە؟ لەگەڵ جۆرەکانی و هۆکارەکانی بوون بە طاغوت چین؟

دوای چەندان باس لە باسکردنی یەکەم فەرمانی الله تعالى کەوا تەنها یەکخواپەرستی (لا إله إله الله)بوو. لێرەوە هەندێک شت باسدەکەین کە پێویستە لەسەر تاک بەتاکی موسڵمان بیزانن و گرنگی پێبدەن، چونکە مەرجن بۆ پاراستنی ئیمان و عەقیدە. بەم ئایەتانە دەست پێدەکەین، قال الله تعالى في كتاب الكريم:

﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ﴾[٢].

ئەم ئایەتە دیسانەوە بەڵگەی یەکەم فەرمانە کەوا تەنها خوداپەرست بین {أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ} ئەم باسەمان باسکرد، ئێستا

١ صحيح مسلم، كتاب إمان.

٢ سورة النحل: ٣٦

پێویستە باسی دووەم بزانین ئەویش {وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ}. ئەو شتە چییە کەوا الله لە زمانی هەموو پێغەمبەرانەوە علیهم السلام گەلانی لێ ئاگادارکردووەتەوە دووربکەونەوە لێی بە ئێمەشەوە.

**(طاغوت):** هەریەک لە موفەسیرانی ئیسلام هەر لە ئیمام "إبن كثير" و "امام طبرى" و "امام قرطبى" و "امام البغوي". {وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَ} واتە دووركەوتنەوە لە هەرشتێک جگە لە الله بپەرسترێت. وەک شەیتان و مرۆڤ و (صنم) بت، کۆتاییان پێهێنا.

ئەم وشەیە پێچەوانەی (لا اله الا الله)یە، واتە دژیەکن. من بۆئەوەی ڕوونتر تێبگەن و ئاسان تربێت لەم وشەیە مانای (لا اله الا الله) بزانە، ئنجا پێچەوانەی بکەیتەوە دژ دەبێت واتە (طاغوت) بڕیاردانی خوایەکی ترە. بەمەش (لامعبود بحق إلا الله) نامێنێت دەیکاتە شتێکی تر.

**(طاغوت):** واتە زێدەڕەو و لەسنوور دەرچوون، چی سنورێک؟ (حدود الله). وقال الله تعالى: ﴿وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٢٢٩﴾.

**یەکەم سنوربەزێن (طاغوت):**

یەکەم سنووربەزێن "شەیطان" بوو علیه من الله لعنة سنووری بەزاند، چۆن؟ قال الله تعالی: ﴿أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٣٤﴾ کەواتە لەخۆبایی بوون و کیبر وا دەکات سنوور بەزێن بێت. هەروەها نمونەی "فیرعەون"مان هەیە کەوا لەچەندان ئایەت لە قورئان باسکراوە، قال الله تعالی فی کتاب العزیز: {إِنَّهُۥ طَغَىٰ} بۆچی؟ چونکە ووتی قال الله تعالی: ﴿أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٢٤﴾ سەیربکەن سنووری بەزاند کە بۆی دانرابوو لە ڕێگا دەرچوو. سنووری بەندە، واتە مرۆڤ ئێمە بەندەین دەبێت ملکەچی پەرستن بین کەوا ئەو پەرستراوە اللهیە، یان لە بارەی ئەم وشە (طاغوت) لە ئایەتێکی تر لە سورەتی (البقره) قال الله تعالی: ﴿فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ﴾.

موفسیران واتە "إبن کسیر" و "إمام طبری" زۆرینە کۆکن لەسەرئەوەی کەوا دوورکەوتنەوە لە (طاغوت) واتە دورکەوتنەوە لەوانەی سنووریان بەزاندووە وەک "شەیطان" و مرۆڤی لە سنوور دەرچوو. بەشی دووەمیش بەڕاست دانانی یان تصدیق کردنی (لا إله الا الله)یە. بۆیە مەرجە ئیماندار بەرائەت لەمانە بکات کە لە ڕێبازی شەیطانن، ڕێبازی شەیطانیش هەموو ڕێگایەکە جگە لە ڕێگای ڕاست نەبێت کە ئیسلامە.

## جۆرەکانی سنوربەزێنەرەکان (الطواغیت) چین؟

لێرەدا درێژە بە ناساندنی سنووربەزێنەکان، واتە (طاغوتەکان) دەکەین، کەوا ڕۆژانە بەچاوی سەر زۆرینەیان دەبینین.

### یەکەم: سنوربەزێن واتە (رأس الطواغیت) "شەیتانە":

شەیطان سەری هەموو گومڕاییەکە لەبەرئەوەی تاغووت هەوڵی (إفساد) خراپکردنی خەڵک دەدات، بۆیە یەکەم دووژمن و سنوربەزێن شەیطانە کەوا بەڵێنیداوە زۆرینەی زۆری خەڵک گومڕا بکاتن. وەک لەم ئایەتانەدا، وقال الله تعالى في كتاب الكريم: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾﴾ وقال الله تعالى: ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ﴾[١] وقال الله تعالى: ﴿قَالَ أَرَأَيْتَكَ هَٰذَا الَّذِي كَرَّمْتَ عَلَيَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ الْقِيَامَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾﴾[٢].

بەڵێ چەند ئایەتێکی تریش هەن کەوا وەعدی داوە تا پێی بکرێت بەنی ئادەم گومڕا بکات، سەریان لێ بشێوێنێت ڕێگای

---

١ سورة النساء: ١١٩

٢ سورة الإسراء: ٦٢

جەهەنەمیان بۆ بڕازێنێتەوە وایان لێبکات وابزانن کەوا هیدایەت دراون. بەڵام لە ناوەڕۆکدا لەگومڕایەکی قوڵدا دەژین. بۆیە لەبارەی ئەم طاغووتە الله تعالی لە چەندان ئایەت ئاگاداری کردووینەوە کەوا بەرائەتی لێبکەین لێی دووربکەوینەوە وەک، قال الله تعالی: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ۚ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾﴾ بەهیچ شێوەک نابێت شوێن هەنگاوەکانی بکەوین چونکە سەرەتای ڕێگای دۆزەخە، وقال الله تعالی: ﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾ لێرەش خوای تعالی پێمان دەفەرموێت دووژمنی ئاشکرامان ئەوە واتە شەیتان بیشی ناسن، دەبێت بەهەموو شێوەیەک دژایەتی بکەین. یان قال الله تعالی: ﴿۞ أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ ۖ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٠﴾﴾ کەواتە ئەم (ملعون) نەفرین لێکراوە ئامانجی گومڕاکردنە کە لە حەقیقەتدا زۆرینەی زۆری گومڕاکردووە سەری لێشیواندوون باطلی لە لا جوانکردوون.

### دووەم: (أشخاص) واتە کەسەکانن:

ئەم جۆرەیان ئەم سەرکردانەن کەوا سنووریان بەزاندووە و بەهەموو شێوەیەک ڕێگریشن لە بەندایەتی الله تعالی. وەک لە نموونەی فیرعەوندا کاتێک بە گەلی (میسر) دەڵێت، قال الله

تعالى في كتاب العزيز: ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾﴾[1].

دەسەڵاتی خۆی عەرزی گەلەکەی کرد وای دەردەخست خاوەنی هەموو شتێکە بەوەی کە سەرۆکی وڵاتە، وڵات بەدەست ئەوە. بەمەش کیبر دەنوێنێت سنوور دەبەزێنێت، یان قال تعالى: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرِي﴾[2].

سەیری بکەن وای خستووەتە بەرچاوی گەلەکەی تەنیا ئەو خودایە. بەسەر سووڕمانەوە دەڵێت نەمزانیووە جگە لە من خودایەکی تر هەبێت؟ یان چی بەگەلەکەی دەوت، قال الله تعالى: ﴿مَآ أُرِيكُمْ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهْدِيكُمْ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾﴾ سەیری سنوور بەزاندنی گەیشتووەتە لووتکە! بۆچی نموونەم بە فیرعەون هێناوە، چونکە لە قورئان زۆر باسکراوە و پەندێکی زۆر گەورەشە. کەواتە ئەوانەی ڕێگرن لە جێبەجێکردنی حوکمی ئیسلام و ڕێگای هیدایەت و ڕازین بەکۆیلەکردن و بەندایەتی

---

١ سورة الزخرف: ٥١

٢ سورة القصص: ٣٨

کردنی خەڵک بۆیان ئەوانە سنوور بەزێنن (طاغوتن). دەبێت لێیان دووربکەوینەوە.

## هۆکارەکانی بوون بە طاغووت چین؟

لێرەدا درێژەی باسی سنووربەزێنەکانە (الطواغیت)، بەڵام ئەمجارە باسی دار و دەستەکانیان لەگەڵ ملکەچبوونی خەڵکیش بۆیان یان چی شتێک پێویستە لەسەرمان وەک موسڵمان و شوێنکەوتەی ئیسلام بیکەن بەرامبەریان؟

- هۆکاری بوون بە طاغووت ئەمانەن:

**هۆکاری یەکەم: ملکەچی خەڵک بۆ سنووربەزێنەکان (الطواغیت)**

یەکەم هۆکار یان ڕێگای سنووربەزاندن لەلایەن زاڵمان بوونی کۆیلە و خەڵکێکی ملکەچی زۆرە بۆ هەموو شتێک، واتە دەسەڵاتی زۆر وا دەکات (کیبر) لووتبەرزی بنوێنێن. ئنجا لەگەڵ سەمع و طاعەیەکی زۆری دەوروبەر و سەربازەکانیان. دەگەڕێینەوە نموونەی فیرعەون. قال الله تعالی: ﴿إِنَّ فِرۡعَوۡنَ

عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤﴾﴾[1].

هەریەک لە موفەسیرین "إمام طبرى" و "إبن كثير" (علا فى الأرض) دەڵێن (جبار) و زۆردار و ستەمکار و هەروەها {وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا} واتە مەبەست بنی ئیسڕائیلە دەیکردە دوو تاقم، چۆن؟ {يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ} واتە کوڕەکانی سەردەبڕی، بۆچی؟ لەبەر ترسی ئەوەی نەوەک لە نەوەکانیان کەسانێک دروست ببن، ببنە ڕێگیر و تۆڵەی لێبکەنەوە. هەروەها {وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ} ئافرەت و کچەکانیشیان دەکردە خزمەتکار. سەیری ئەم زاڵمە کە لە ئێستاشدا نمونەیان گەلێک زۆرە دەرهەق بە ئەهلی ئیمان و موسڵمانان. کێ لەبەرامبەردا گوێڕایەڵی فیرعەونی دەکرد سەرەڕای زۆرداری و ستەمکاری؟! قال الله تعالى: ﴿فَٱسۡتَخَفَّ قَوۡمَهُۥ فَأَطَاعُوهُۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾﴾[2].

بەڵێ دەبینن گەلەکەی گوێڕایەڵبوون ملکەچبوون و کویلەبوون، بۆیە ئەم گەلانە یان ئەم قەومانە لای خوای تعالى: {إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ}. کەواتە ملکەچبوون بۆ سنووربەزێنەکان

---

١ سورة القصص: ٤

٢ سوره الزخرف: ٥٤

(طاغوت)، نیشانەی فسق و فجورە و نیشانەی نەویستنی حوکمی اللهیە.

**هۆکاری دووەم: سەربازی سنوربەزێنەکانن، واتە (جنود الطواغت):**

ئایا فیرعەون بەتەنها دەیتوانی ئەم هەموو ستەمە بکات یان ئەم هەموو منداڵە سەرببڕێت یان ئەم هەموو خەڵکە بگرێت؟ نەخێر هەرگیز نەی دەتوانی بەڵکو فیرعەون تەنها فەرمانی دەکرد سەربازەکانیشی جێبەجێیان دەکرد. لە شەرعدا واتە دین حوکمی هەردووکیان یەک بەیەک جێگایان دۆزەخە بەبەڵگەی ئەم ئایەتە، قال الله: ﴿وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدْخِلُوٓاْ ءَالَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ ٱلْعَذَابِ ﴿٤٦﴾﴾[١].

واتە لەڕۆژی قیامەت فیرعەون و (آل) دار و دەستەکەی پێکەوە دەخرێنە یەک جێگا و یەک سزای بە ئێش و ئازاریان هەیە. آل فرعون کێن؟ ﴿إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُواْ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾﴾[٢].

١ سورة غافر: ٤٦

٢ سورة القصص: ٨

فیرعەون خۆی ئنجا هامان کە وەزیرە واتە ڕاوێژکار و تەکبیرکار و پلاندانەری فیرعەونە بۆ جێبەجێکاری سەرەکی پیلانەکانی فیرعەون و فەرمانەکانی بوو چۆن؟

لەم ئایەتە جوانتر ڕوون دەبێتەوە، وقال الله تعالى: ﴿وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبۡنِ لِي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَبۡلُغُ ٱلۡأَسۡبَٰبَ ٣٦﴾[١].

لێرەدا دەبینین فیرعەون دەڵێت وەزیر، وەزیر واتە هامان ئەویش هیچی پێ ناکرێت بێ جنودە! کەواتە هەرسێکیان تەواوکەری یەکترن فیرعەون و هامان و جنودەکان. بۆیە هیچ عوزرێک بۆ سەربازیکردنی سنووربەزێنەکان واتە طاغوتەکان نییە. چونکە هەمان حوکمیان هەیە. کەواتە چی شتێک لەسەر ملکەچی فیرعەون و هامان بکرێت واتە سنووربەزێن سنوری کێ دەبەزێنن؟ سنوری الله تعالى کە ڕێگرییە لە حوکمی الله و ڕێگرییە لە موسڵمانان و دژایەتی کردنیەتی بەهەموو ئەسباب و ڕێگا ( خفی) و (علەنیە)کان، واتە ڕێگای ئاشکرا و نهێنیش بەکاردەهێنێت. بۆچی موسا و هارون علیهما السلام نەچوونە باری ژێر حوکمی فیرعەون؟ بۆچی بەنی ئیسرائیلی ئەو کات کە چەوساوەبوون کە موسڵمان بوون سەرەڕای ئەم هەموو کوشت

---

١ سورة غافر: ٣٦

و بڕینەی فیرعەون، کەچی نەچوونە ژێر حوکمی فیرعون بەڵکو کەوتنە شوێن موسا و هارون علیهما السلام؟!

## باسی نۆیەم: (شرك) یان هاوبەش پەیداکردن بۆ الله چییە؟

لەم باسەدا قۆناغێکی تری عەقیدە و ئیمان باسدەکەین کەوا دوای عیبادات واتە پەرستن (لا إله إلا الله)، ڕاستەوخۆ فرمانمان پێکراوە کەوا دەبێت فەرمانەکەش جێبەجێ بکەین گەرنا هەرچی کردەوە هەیە پووچەڵ دەبێتەوە و بەبا دەچێت.

دەچینە خزمەت قورئان، بزانین چۆن بۆمان باس دەکات. لەسەرەتادا دەبێت بزانین پەیامی هەموو پێغەمبەران علیهم السلام دوای تەوحید و دوای عیبادات الله تعالی ئەمە بووە. قال الله تعالی سورة الأعراف: ﴿قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ﴾.

واتە دوای داواکردنی عیبادەت بۆ خوای تعالی پێشیانی ڕاگەیاندوون کەوا هیچ خودایەکی تر نییە واتە هاوبەشی نییە و نابێت. بۆیە دووربکەونەوە لە (الشرك).

بێگومان شیرک زۆر جۆری هەیە، بۆیە رسول الله ﷺ لە فەرموودەیەک بۆمان وەسف دەکات کەوا هێندە وورده وەک مێرولەیەکی ڕەش لەشەوی تاریکدا وایە. شیرکی گەورە گەر تۆبەی لێ نەکات خاوەنەکەی (خالدا مخلد في النار) هەتا هەتایی لە ئاگر دەبێت.

شیرکی بچووکیش زور جۆری هەیە، بەڵام خاوەنەکەی دەپارێزێت لە (خلد)، واتە هەتا هەتایی لە ئاگر نامێنێتەوە. دەبێت ئێمە بەردەوام ئەم دووعایە بکەین (یا الله پەنات پێ دەگرین لەو شیرکانەی کەوا دەیزانین و داوای لێخۆشبوونیشت لێ دەکەین لەوانەشی کە نایزانین).

ئەوەی گرنگە بۆتان باسبکرێت گەورەکانە هەرچەندە بچووکیش گرنگە، بەڵام باسەکە زۆر درێژ دەکاتەوە لەوانە، جۆرەکانی شیرکی گەورە:

**١. هاوبەش دانان (شرك) لە عیباداتکردندا.**

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾.

بەڵێ واتە الله تعالى بە رسول الله ﷺ دەفەرموویت: بڵێ بەوان بەموشرکین و کوفار و خەڵک، بڵێ دوای عیبادات و تەئکیدکردنەوەی تەوحید و یەکخواپەرستی و وشەی لا اله الا الله واتە {أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ}، دووپاتکردنەوەی تەوحیدە و بەریئە لە هەموو شرکێک، لا اله الا الله تەواو.

دواتر دوای بانگەوازکردن و ئاگادارکردنیان، پێیان دەفەرموویت هەریەک لە ئێوە ئارەزوو و ئاواتی گەیشتنە بەدیداری الله باکردەوەی چاک بکات و هەروەها {وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا} بەهیچ شێوەیەک هاوبەشی بۆ پەیدانەکات لە پەرستن. ئەمە جۆرێکە لەجۆرەکانی شیرکی أکبر کەوا نابێت ئەنجام بدرێت.

## ٢. هاوبەش دانان (شرك) لە حوکمدا.

ئەم جۆرەیان زۆربەی عالەمی ئیسلامی گرتووەتەوە. ئەمەشیان جۆرێکە لە جۆرەکانی شیرکی گەورە الله پێمان دەفەرموویت، قال الله تعالى: ﴿قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَٱلۡأَرۡضِۖ أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٦﴾[1].

{وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا} ناکرێت و نابێت جگە لە ئیسلام حوکمێکی تر فەرزبکرێت، حوکمی الله لەسەر زەوی کە ئیسلامە هەموو شتێکی ڕوونکراوەتەوە. بۆیە دانانی تەشریعی دەستکرد و لابردنی هەندێک ئایەت و گونجاندنیان کوفرە و شیرکە ڕێگەپێنەدراوە لای الله. بۆچی؟ چونکە الله پێمان دەفەرمووێت قال الله تعالى: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾﴾[2].

حوکم تەنیا بۆ اللەیە ئا بەمشێوەش فەرمانمان پێکراوە جێگیرە و نەگۆڕاوە ملکەچ بوونت بۆ یەک حوکمی تری جگە لە ئیسلام شیرکە و لەچەندان ئایەتدا ئەم شتە تەئکیدی لێکراوەتەوە وەک: ﴿ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾﴾ هەروەها لەم ئایەتانەشدا، يقول الله تعالى: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ يَقُصُّ ٱلۡحَقَّۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾﴾ هەروەها قال الله تعالى: ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾﴾ هەروەها ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ﴾

---

١ سورة الكهف: ٢٦

٢ سورة يوسف: ٤٠

ویقول جل وعلا: وقال الله تعالى ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ٦٧﴾ ويقول تبارك وتعالى: ﴿فَٱلۡحُكۡمُ لِلَّهِ ٱلۡعَلِيِّ ٱلۡكَبِيرِ ١٢﴾ ويقول رب العرش العظيم: ﴿وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ﴾.

ئەمانە و چەندان ئایەتی تر دووپاتکردنەوەی حوکمە تەنیا بۆ الله لە دونیا و لە ئاخیرەتدا. بێگومان جگە لە حوکمی الله وەک عەلمانیەت و مارکسیەت و ئاگرپەرستی، بۆچی؟ چونکە ئەمان حوکم یاسای دروستکراوی خۆیان هەیە جگە لە حوکمی الله بەتایبەت (بتی دیموکراسی) کە زۆرینەی زۆری عالەمی ئیسلامی لە خشتەبردووە و فریوی داون وەک سەرانی قورەیش کە (دارالندوە)یان هەبوو حوکم و ڕاوێژیان تێدا دەکرد و هەروەها الله تعالى لە کۆمەڵێک ئایەتدا تەئکید لەوە دەکاتەوە ناکرێت و نابێت شیرکی بۆ بڕیاربدەین. شیرکی أکبر لەهەر سێ تەوحیدەکە هەیە ئەمانیش:

- **شیرکی ربوبیەت**
- **شیرکی ألوهیەت**
- **شیرکی أصماء والصفات**

هەر سێ جۆرەکە موشریک دەکات و خاوەنەکەی (خالدا مخلدا في النار) پەنا بە الله، واتا هەتا هەتایە چونکە مەرجی کامڵ بوونی ئیمان دەبێت هەرسێ تەوحیدەکەت تەواوبێت کە ربوبیەت و ألوهیەت و أصماء والصفاته. تەنها لە یەکیان موشریک بێت دوانەکەی تر سوودی پێ ناگەیەنێت یان تەنها لە یەکیان هاوبەشی بۆ بڕیاربدات کردەوەکانی پووچەڵ دەبێتەوە، قال الله تعالی: ﴿۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـًٔاۖ﴾[1].

لێرەوە دوای قۆناغی یەکەم پەرستن ڕاستەوخۆ فەرمانکراوە بەوەی هەرگیز هیچ هاوبەشێکی بۆبڕیار نەدەین. قال الله تعالی: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَيَسۡتَخۡلِفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ كَمَا ٱسۡتَخۡلَفَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمۡ دِينَهُمُ ٱلَّذِي ٱرۡتَضَىٰ لَهُمۡ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّنۢ بَعۡدِ خَوۡفِهِمۡ أَمۡنٗاۚ يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ وَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ٥٥﴾[2].

بەکورتی ئەوانەی الله تعالی دەیانکات بەجێنشینی زەوی، ئەوانەن کەوا دەیپەرستن و بەهیچ شێوەک هاوبەش (شرك)ی بۆ پەیدا ناکەن ﴿يَعۡبُدُونَنِي لَا يُشۡرِكُونَ بِي شَيۡـٔٗاۚ﴾.

١ سورة النساء: ٣٦
٢ سوره النور: ٥٥

هەروەها لە فەرموودە صەحیحەکاندا دیسانەوە لەدوای عیبادات دەبێت شیرک پەیدانەکرێت.

وەک لە "صحیح مسلم" (کتاب إمان):

لە "أبی ئەیوب"ەوە الله لێی ڕازی بێت، پیاوێک هاتە لای پێغەمبەر ﷺ وتی کارێکم پێ بڵێ یان شتێکم پێ بڵێ نزیکم بکاتەوە لەبەهەشت و دووریشم بکاتەوە لە جەهەنەم. فەرمووی: (تعبدوا الله ولاتشرکوا بە شیئا). دواتر نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ بکەیت.

دیسانەوە لە "صحیح مسلم" (کتاب إمان):

لە "ئەبی هرێرە"وە الله لێی ڕازی بێت، پیاوێک هاتە لای رسول الله ﷺ پێی فەرموو کارێکم پێ بڵێ گەر بیکەم بچمە بەهەشتەوە. فەرمووی: (تعبدوا الله ولاتشرکوا بە شیئا).

بەڵێ دوای عیبادات ڕاستەوخۆ داوامان لێکراوە شیرک واتە هاوبەش پەیدانەکەین.

یان لە (صحیحین) "بخاری ومسلم"دا هاتووە کاتێک "معاذ بن جبل" رضی الله عنە لەدوای وڵاخەکەی سوار دەبێت و سێ جار پێی دەفەرموێت: ئەی "معاذ بن جبل" دەزانیت چی شتێک

مافی خوای تعالی یە بەسەر بەندەکانیەوە. ئەویش دەفەرموویێت الله و رسولەکەی زاناترن. ئەویش دەفەرموویێت: (حق الله على العبد یان عیباد ان تعبدوا ولاتشرکوا به شیئا).

واتە بیپەرستیت و هەرگیز هاوبەشی بۆ بڕیار نەدەیت.

ئنجا باسی گەورەترین تاوان یان (أكبر الكبائر) دەکەین پشتیوان بە الله کە (شرکە) واتە هاوبەش دانان. لێرە بەکورتی لەسەر شرک بەتێکەڵی هەندێک باسی دەکەم تەنیا وەک بیرهێنانەوە. لەڕێگەی هاوبەش دانان ئەم کەسە پێیوایە جگە لە الله خودایەکی تر هەیە. جا بە هەموو جورەکانیەوە و شرک. شیرک لە (الربوبیة) هەیە و لە (الألوهیة) هەیە و لە (أسماء والسیفات) هەیە. (شرک) دووجۆرە، یەکێکیان گەورە واتە *(شرک الأکبر)*. ئەمە خاوەنەکەی هەرگیز لێخۆشبوونی بۆ نییە و لە جەهەنەمدا دەمێنێتەوە (خالدا_مخلدا) هەتا هەتایی.

وەک هاوارکردن جگە لە خوای تعالی "فڵان هاوارم بۆ تۆ هێناوە" یان "فڵان نەخۆشم چاکم بکەوە" یان سەربڕین بۆ جگە لە الله وەک سەربڕینی مەڕو شتی وا لەسەر قەبرەکان یان لەسەر فڵان پەرستگای دروستکراوە جا بەهەر مەبەستێک بێت!! یان پێتوابێت جگە لە الله کەسێکی تر ڕزقی بەدەستە، ئەم ترسە وات

لێبکات کە گەر پارەکە یان کارەکەت حەرام بێت بڵێیت گەر نەیکەم ڕزقم دەبڕێت ڕزقم لێرەدایە یان بەمەبەستی خۆپاراستن لە هەرشتێک بێت وەک دانانی (چاوەزار) یان (ناڵی گوێدرێژ) لە ماڵ یان لەسەر کارەکەت و پێتوابێت دەتپارێزێت یان پەرستنی (دار) یان (بەرد) یان (ڕۆژ) یان (مانگ) یان (ئەستێرە) یان هەواو نەفسیان دەپەرستن.

جا بۆیە لە (صحیحین)دا هاتووە: (من كان يعبدوا شيئا فليتبع ومنهم من يعبد الشمس ومنهم من يعبد القمر ومنهم من يعبد الطواغيت). سەیربکەن پەرستنی تاغوت واتە گوێڕایەڵی کردنیان، جێبەجێکردنی فەرمانیان بە گەورە دانانیان. ئەمەی نێو کەوانە کە چەندەها جۆری تری هەیە فەرمانمان پێکراوە دوای عیبادات بەهیچ شێوەک نەیکەین (وأعبدوا الله ولاتشركوا بەشيئا). کەواتە بۆیە الله تعالى لە قورئان دەفەرموێت، قال الله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ گەورەترین ستەم بەندە بیکات (شرک) هاوبەش بڕیادانە.

لەفەرموودەی صحیحی "مسلم"دا هاتووە رسول الله ﷺ سێ جار بە هاوەڵەکانی دەفەرمووێت: (ألا أنبئكم بأكبر الكبائر الإشراك بالله الشرك).

واتە پێتان بڵێم گەورەترین تاوان چییە، هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای تعالی یە.

بۆیە لە قورئاندا لەبارەی ئەوانەی پارێزراون لە قیامەت دەفەرموویت، قال الله تعالى في كتاب الكريم: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ٨٢﴾.

لەصحيح "مسلم"دا هاتووە لە كتاب (التفسير) لەكاتی دابەزینی ئەم ئایەتە (شد على أصحاب رسول الله) واتە زۆر سەخت بوو لایان، دڵگران بوون هەموو ووتیان جا کێ لە ئێمە ستەمی نەکردووە؟ رسول الله ﷺ پێی فەرموون بەمشێوە نییە کە تێی گەیشتوون، بەڵکو ئەم ئایەتەی بەسەر خوێندن، قال الله تعالى (لقمان): ﴿إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ١٣﴾ بۆچی گەورەترین تاوانە؟ قال الله تعالى: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ﴾[1] یان قال الله: ﴿بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ فَمَن يَهۡدِي مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ٢٩﴾[2]شوێن کەوتنی هەواونەفس واتە عیبادەت، یان قال الله تعالى:

---

١ سورة البقرة: ١٦٥

٢ سورة الروم: ٢٩

﴿وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ ۖ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٠٠﴾﴾[1].

(جن) دەکەنە شەریک، پەرستنی (جن) یان کوڕی کچی بۆی بڕیاردەدەن یان قال الله تعالی: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدًا ۗ سُبْحَٰنَهُۥ ۖ﴾[2].

دەڵێن الله کوڕی هەیە پاک و بێگەردی شایستەی اللهیە. دەیان نمونەی تر لە قورئان باسکراوە وەک یەهود دەڵێن "عوزێر" کوڕی خوایە یان گاور دەڵێن "عیسا" علیه السلام کوڕی خوایە پاک و بێگەردی بۆ الله لەم درۆیانە. کەواتە أکبر الکبائر، چونکە ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾﴾ ئەم تاوانە گەورەیە زۆر وردە گەر وریا نەبین تێ دەکەوین. دواتر باسی سزا و هەڕەشەکانی الله تعالی بۆ هاوبەش بڕیاردەران باسدەکەین بە تەسەلسول.

---

١ سورة الأنعام: ١٠٠

٢ سورة البقره: ١١٦

## باسی دەیەم: هەڵوەستەیەك لەسەر موشریكانی كۆن و ئێستا و باسی "أبوجهل" لەڕوانگەی شەرعەوە

هەڵوەستەیەکی گرنگ لەسەر موشریک، زۆرینە واتێگەیشتوون کە بڵێیت ئەم کەسە موشریکە وا دێننە پێش چاویان کەوا هەرگیز بڕوای بەخوای نییە یان لەجیاتی الله پەرستن، واتە عیبادەتکردن عیبادەتی بتێک دەکات یان بەردێک یان هەرشتێکی لەو شێوەیە. بەڵام لەڕاستیدا بەمشێوە نییە بەڵکو کەسی موشریک واتە بۆنمونە، قورەیش یان جاهیلیەتی پێش ئیسلام موەحید بوون لە "ربوبیەت" بڕوای (کلی) واتە بڕوای تەواوەتیان پێ هەبووە کە (رب العالمین)ە. چۆن لەقورئاندا الله بۆمان ڕوون دەکاتەوە لەم بارەوە قال الله تعالى: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ الْعَزِيزُ الْعَلِيمُ ۝٩﴾[١].

الله تعالى بە پێغەمبەرمان دەڵێت گەربێت و تۆ لێیان بپرسیت کێ ئاسمانەکان و زەوی دروستکردووە؟ وەڵامیان ئەوەیە کە دەڵێن (العزیز العلیم) واتە سیفەتی گەورەی دەدەنە پاڵ و

---

١ سورة الزخرف: ٩

ئیعتراف دەکەن کە اللەیە (رب السماوات والارض)، بەڵام هەر موشریکن بۆچی؟ چونکە غەیری اللەش دەپەرستن.

لە ئایەتێکی تردا دەفەرموویێت، قال الله تعالی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾﴾[1].

لەم ئایەتەش داندەنێن بەوەی الله جگە لەوەی ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە، لەهەمان کاتدا خۆر و مانگیشی بۆ موسەخەرکردوون. لەئایەتێکی تردا ووردتر دەبێتەوە دانپێدانانیان لەسەر ئەم شتەدا ئەمیش، قال الله تعالی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّن نَّزَّلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ مَوْتِهَا لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۚ قُلِ الْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٦٣﴾﴾[2].

لەم ئایەتشدا داندەنێن بەوەی بارانیش و زیندووکردنەوەی زەوی دوای مردنی هەر بەدەستی اللەیە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی زۆری بیر ناکەنەوە و عەقڵیان ناخەنەکار. لەئایەتێکی تریشدا الله بۆمان ڕووندەکاتەوە لەسەریان، قال الله تعالی: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ

---

١ سورة العنكبوت: ٦١

٢ سورة العنكبوت: ٦٣

﴿قُلْ مَنۢ بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَىْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾﴾[١].

لەم ئایەتانەشدا هەم دیسانەوە الله دەفەرمووێت پێیان بڵێ ئەی محمد ﷺ دیسانەوە داندەنێن کە (رب العرش) هەر اللهیە و هەموو شتێک هەر بەدەست ئەوە، واتە ئەوان دووپاتیان دەکردەوە لە "ربوبیەت" دانیان دەنا بە تەوحیدەکە. بەڵام لە "ئولوهیەت" هاوبەشیان بۆ بڕیاردەدا. چۆن؟ قال الله تعالی: ﴿أَفَرَءَيْتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَوٰةَ ٱلثَّالِثَةَ ٱلْأُخْرَىٰٓ ﴿٢٠﴾﴾[٢].

(لات و عزا) کومەڵە بت و هەندێکی تر کەوا پیرۆز کرابوون، تەنانەت قوربانی و سەربڕینیشیان بۆ دەکردن. "ابن جریر" دەڵێت: (للات) واتە بە تەشدیدی الله پەنا بەالله (عزی) واتە عزیز.

ئەمە بڕوایان بوو یان (هووبەل) و هاوشێوەکانی یان شوێنێک هەبوو بەناوی (کعبە الیمانیە) یان (شأمیە) کە رسول الله ﷺ "جریر بن عبدالله"ی نارد لەگەڵ پێنج سەد سوار ڕووخاندیان

---

١ سورة المؤمنون: ٨٦-٨٩

٢ سورة النجم: ١٩-٢٠

و سووتاندیان. هەروەها لە جەنگی ئووحد "ابی سفیان" هاواری دەکرد (لنا العزی ولاعزی لکم)، واتە بڕوایان وابوو کە تەنانەت هۆکاری سەرکەوتنیان و شکستی موسڵمانانە. ئەوەبوو کەوا (عزی)یان لەگەڵ بوو بەڵام رسول الله بە "عمر" دەڵێت: پێیان بڵێ (الله مولانا ولامولی لکم).

لە "صحیح بخاری"دا هاتووە لەکاتی فەتحی مەککەدا "ابن مسعوود" دەڵێت: چواردەوری کەعبەی پیرۆز سیسەد و شەست بتی تێدا بوو بەدارێک بتەکانی دەشکاند و دەیگووت (جاء الحق وزهق الباطل).

هەروەها لەکاتی خۆی لەنێو کەعبەدا کۆمەڵە بتێکی تێدا بوو، لەوانە وێنەی "ابراهیم" علیه سلام و "اسماعیل" علیه سلام، واتە ئەمە چیمان پێدەڵێت، پێمان دەڵێت ئەوان خۆشەویستیان بۆ شێخ و کەسەکان تووشی شیرکی کردوون. بۆچی دەیان پەرستن؟! الله وەڵامان پێدەڵێت لەبارەیانەوە، قال الله تعالی : ﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءَ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَىٰ﴾[١].

١ سورة الزمر:٣

واتە هاوار وناڵە و تکایان بۆ ئەم ئەولیا و بتانەیە. دەڵێن خۆ ئێمە بۆ پەرستن نییە، نایان پەرستین، بەڵکو بۆ نزیکبوونەوەمانە لە الله! لەئایەتێکی تردا قال الله تعالى: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[١].

واتە عیبادات و عبدایەتی بۆ شتانێک دەکەن کە نە سودیان هەیە بۆیان و نە زیان وەک دار و بەرد، کەچی دەڵێن ئێمە بۆ ئەوەمانە ئەوانە شەفاعەت کارمانن لای الله بۆمان!

ئەمەش ڕەددێکە بۆ ئەو قەبر پەرستانەی هاواری سەر قەبر و شێخەکان دەکەن، دەشڵێن ئەوانە ئەولیای اللهن پەنا بە الله. بۆیە نمونەی بە قوڕەیش دەهێنمەوە تابزانرێت ئەوان چۆن بوون و بیرکردنەوەشیان، چۆن موشریکی ئەمڕۆ زۆر خەراپترە لە موشریکی کۆن، لەبەرئەوەی موشریکانی قوڕەیش و پێش ئەوان لەکاتی ئاسایدا بڕوایان بە تەوحیدی "ربوبیەت" هەبوو و لەکاتی تەنگانەشدا دەبوونە موەحیدی تەواو کە الله ئەم شتەمان بۆ ڕووندەکاتەوە، چۆن؟ قال الله تعالى: ﴿هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ

١ سورة يونس: ١٨

﴿وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٢٢﴾[1].

ئەم ئایەتە دەلالەتە لەوەی کەوا لەکاتی تەنگانە و ناخۆشیدا موخلیص بوونە بەهەموو شێوەک دوعایان تەنیا تەنیا بۆ اللهبووە نەک، یا لات! یا هووبەل و وود و سواع و هاوشێوەکانیان! بەڵام موشریکانی ئەمڕۆ لەکاتی ئاسایی هەر موشریکن و لەکاتی ناخۆشی و ناڕەحەتیشدا موشریکترن، ئەمیش دەڵێن یا فلان! شێخ هاوارە! یا جدی فلان! یا رسول الله هاوارە! تەنانەت نابێت هاوار بۆ رسول اللهش بەریت، هەربۆیە الله بۆمان ڕووندەکاتەوە و پێمان دەڵێت، قال الله تعالی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ٢﴾[2].

لەم ئایەتەدا فەرمان کراوە کەوا الله بپەرستین بە پاک و بەتەنها و بێ هیچ هاوبەش و بڕیاردەرێکی تر لەگەڵی و بێ هیچ (لات و عزی)یەک، بۆچی؟ لەبەرئەوەی، قال الله تعالی: ﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُ﴾ بێگومان تەنیا بۆ اللهیە عیبادەتی موخلیص. بە

١ سورەتی یونس: ٢٢
٢ سورة الزمز: ٢

ئیخلاص چییە کەوا الله پێمان دەڵێت؟ قال الله تعالى: ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَلَا تَقْتُلُوا أَوْلَادَكُم مِّنْ إِمْلَاقٍ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ وَلَا تَقْرَبُوا الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَلَا تَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾﴾[١].

ئەمە عیباداتی حەقە کەوا الله تعالى داوای کردووە لە رسول الله ﷺ پێمان بڵێت ئەو شتانەی کەوا الله لێی حەرام کردووین، ناشبێت بەهیچ جۆرێک شیرک یان هاوبەشی بۆ بڕیاربدەین. لە (صحیحین) واتە بوخاری و موسلیمدا هاتووە کەوا هاوەڵان دەیانفەرموو رسول الله بیعەتی لێوەرگرتووین کەوا بیعەتی پێبدەین کە شیرک بۆ الله بڕیار نەدەین، وەک "مغیره بن شعبه" الله لێی ڕازی بێت. تەنانەت بەیعەتی کە لە ئافرەتانیش وەرگرت (على ان لاتشركوا بالله شيئا).. ئنجا مەرجەکانی تری وەک زینا و دزی و بوختان.

ئەمە دینی خالیصە بۆ الله کەوا بەمشێوە لێمان قبوڵ دەکاتن گەرنا نوێژ بکەین و ڕۆژوو بگرین و حەج بکەین، بەڵام شیرک

١ سورة الأنعام: ١٥١

بۆ الله بڕیاربدەین ئەوا الله بۆمان ڕووندەکاتەوە کە کردەوەکانمان چی لێدێت. قال الله تعالی: ﴿وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾﴾[1].

هەرچی کردوەیان هەبێت لەقیامەتدا وەک تۆزی بابردووی لێدێت. موفەسیران دەڵێن کاتێک تیشکی ڕۆژ لە کونێکەوە دەچێتە ژوورێکی تاریکەوە ڕووناکیەکەی غوباری لەگەڵە ئاوای لێدێت. بۆچی؟ چونکە عیبادەتەکەیان بەپاکی و بەبێگەردی بۆ الله نەبووە.

## ڕوونکردنەوەیەک: لەسەر موشریکانی قوڕەیش و "ابوجهل."

بێگومان لەزۆرینەی ئوممەت دەزانن "ابوجهل" کێ بوو و چۆن بوو، تەنانەت بە فیرعەونی ئەم ئوممەتە مەشهور بوو، بەڵام موشریک بوو. "ابوجهل" و سەرانی قوڕەیش پیاوچاکی زەمانی جاهیلی بوون، ئەوان کەعبەیان بەڕێوە دەبرد و نان و ئاویان دەدا بە حاجیەکان و بەڕۆژوو دەبوون وەک لە "صحیح بخاری"دا هاتووە، دایکمان "عائیشە" الله لێی ڕازی بێت دەڵێت: کانت العاشوراء یصومون قریش فأمر رسول الله بصیامه.

---

١ سورة الفرقان: ٢٣

واتە پێش دابەزینی و فەرزبوونی ڕەمەزان بوو، ئنجا دواتر موخەیرکران (فمن شاء صام ومن شاء أفطر). هەروەها حەجیان دەکرد، لەدەوری کەعبە دەسوڕانەوە و بڕوایان بەوە هەبوو (رب العالمین) خالقی ئاسمان و زەویە. بەڵام هاوبەشیان لەدووعا و عیبادەتدا ئەنجام دەدا. لەسەرەوە ڕوونمان کردەوە بۆچی وایان دەکرد، بەڵام ناخوات چونکە الله عیباداتی خالیصی دەوێت ئەوەتا "أبوجهل" لەڕۆژی (بدر الکبری) چی دوعایەک دەکات.

قال الله تعالی: ﴿وَإِذْ قَالُوا۟ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ۝٣٢﴾[1].

ئەمە دوعای "ابوجهل" بوو، دەستی بەرزدەکردەوە و دەیگووت یا الله ئەگەر ئەم شتە حەقە و تەواوە ئەوا لای تۆوەیە بەردمان بەسەرا ببارێنە یان سزامان بۆ بنێرە. بەڵام الله وەڵامی داوە قال الله تعالی: ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ۝٣٣﴾[2].

---

١ سورة الأنفال: ٣٢

٢ سورة الأنفال: ٣٣

سزایان نادات مادام تۆ ئەی محمد ﷺ لەناویانی و لەکاتێک ئەوان ئیمانداران بەردەوام ئیستغفار دەکەن. بەڵام وەڵامی الله بۆ "ابوجهل" ئەوەیە قال الله تعالی: ﴿وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ ۚ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِنْدَ الْبَيْتِ إِلَّا مُكَاءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنْتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾﴾[١].

لەم ئایەتانەدا دەلالەتی ئەوەن کە سزای الله بۆ سەر "أبوجهل" و شوێنکەوتوانیەتی بۆچی؟ چونکە ڕێگربوون لە عیبادات لە (مسجد الحرام) واتە دەربەدەریان کرد و ڕێیان لێ گرت لە الله پەرستیدا. بۆیە ﴿وَمَا دُعَاءُ الْكَافِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَالٍ ﴿١٤﴾﴾. کەواتە ئەمە حاڵی "أبوجهل" و موشریکانی قورەیش بوو، کەچی خۆیان پێ حەق بوو و محمدیشیان پێ ناحەق بوو. بۆیە لەسەرەتای فەتحی هەموو نوێژێک ئەم ئایەتانە دەخوێندرێت قال الله تعالی: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾﴾[٢].

---

١ سورة الأنفال: ٣٤-٣٥

٢ سورة الأنعام: ١٦٢-١٦٣

ئەمە تەئکیدکردنەوەی تەوحید و یەکخواپەرستییە و دڵنیاکردنەوەی مەرجی ئیخلاصە لە عیبادەتەکانتدا. بۆچی؟ چونکە گەر وانەبێت هیچ کردەوەیەکت لێ قبووڵ ناکرێت و وەرناگیرێت.

## باسی یانزەیەم: سزای کەسی هاوبەش دانەر (المشريك)

لەم باسەدا ئەم سزایە باسدەکەین بۆ کەسی موشریک کە دانراوە لەڕێگەی تەفسیری قورئان بەقورئان. لەیاسەکانی پێشوو باسی گەورەیی ئەم تاوانەمان کرد (أكبر الكبائر). الله تعالى لەم بارەوە دەفەرمووێت، قال الله تعالى في كتاب الكريم: ﴿وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَاسِرِينَ ﴿٦٥﴾﴾[١].

واتە الله تعالى هەڕەشەی توند لەخودی رسول الله ﷺ دەکات بەوەی کەوا هەم بۆ پێغەمبەر و گەلانی پێش تۆ و هەروەها بۆ تۆش گەر بێتو (شرك) هاوبەش بڕیاربدەن و پەیدابکەن ئەوا هەرچی کردەوە و چاکەتان هەیە هەمووی

---

١ سورة الزمر: ٦٥

پووچەڵ دەبێتەوە و بەبا دەچێت. ئەم هەڕەشە بۆ پێغەمبەران ئاوابێت ئەی ئێمە چی!

قال الله تعالی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ٤٨﴾[1].

ئەم ئایەتە دووجار لە هەمان سووڕەت دووبارە بووەتەوە لەبەر گەورەیی تاوانە بەڵام لەدووەم دەفەرموویت: ﴿فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١١٦﴾ کەواتە لەهەموو تاوانێک خۆش دەبێت جگە لە هاوبەش پەیداکردن. واتە لە زینا و مەشروب و دزی خۆش دەبێت ئەمانە خاوەنەکەی لە دین ناکەتە دەر، بەڵام گوناهباری دەکات. بۆیە الله سزاکەی بەپێی تاوانە دەدات. هەرچی شیرکە هەرگیز لێخۆشبونی نییە و دیسانەوە لە قورئان پێمان دەفەرموویت، قال الله تعالی: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ٧٢﴾[2].

واتە بەهەشت بەهەموو شێوەک لەکەسی موشریک حەرام کراوە، لە جەهەنەمدا دەبێت (خالدین فیها).

---

١ سورة النساء: ٤٨

٢ سورة المائدة: ٧٢

قەبر بپەرستی یان شەخس بپەرستی یان طاغوت بپەرستی جگە لە حوکمی اللهت بوویت و پێی ڕازیبیت. لەم فەرموودە صحیحانە ئیمامی "مسلم" لە (کتاب الإمان): (من مات یشرك بالله شیئا دخل النار).

هەریەک بمرێت و (شرك) هاوبەش پەیدا بکات بۆ الله دەچێتە ئاگر .

یان، وَحَدَّثَنِي أَبُو أَيُّوبَ الْغَيْلاَنِيُّ سُلَيْمَانُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ وَحَجَّاجُ بْنُ الشَّاعِرِ قَالاَ: حَدَّثَنَا عَبْدُ الْمَلِكِ بْنُ عَمْرٍو حَدَّثَنَا قُرَّةُ عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ حَدَّثَنَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ: (مَنْ لَقِيَ اللَّهَ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ لَقِيَهُ يُشْرِكُ بِهِ دَخَلَ النَّارِ). قَالَ أَبُو أَيُّوبَ قَالَ أَبُو الزُّبَيْرِ عَنْ جَابِرٍ.[١]

واتە هەریەک بگەڕێتەوە لای الله و هاوبەشی پەیدا نەکردبێت دەچێتە بەهەشتەوە گەرنا دەچێتە جەهەنەمەوە.

ئایەت و فەرموودە لەسەر سزای موشریک زۆرە. جا بۆیە پێویستە خۆمان بپارێزین لەم تاوانە. واز لە هاوارکردن بێنن لە غەیری الله تعالی. "یارسول الله هاوار" شیرکە و دەتکاتە

١ إمام مسلم کتاب (الإمان): ٢٨٠

موشریک یان "خدری زندە هاوار" شیرکە و دەبیتە موشریک یان "حەزرەتی شێخ هاوار" شیرکە و دەبیتە موشریک.

## باسی دوانزەیەم: دەرئەنجامی عەقیدە و ئیمان

لەهەر بابەتێک کاتێک سەرەتایەکی هەبێت دەبێت کۆتاییشی هەبێت واتە خاڵێک بۆ تێگەیشتن. لەم زنجیرە زۆر گرنگەدا کە عەقیدە و ئیمانە باسی (سێ) قۆناغ یان (سێ) بناغـەی زۆر گرنگی ئیماندارمان کرد کەوا پەیوەستە بە بناغەی مرۆڤی ئیماندار و پێویستە لەسەر تاک بەتاکمان زۆر ووردبین لە جێبەجێکردنی ئەم بناغانە گەرنا (سەد) ساڵ نوێژ و ڕۆژ هیچ سودێکمان پێ ناگەیەنێت. وەک لە یەکەم خاڵدا ووتنی (لا إله إلا الله)یە (قولا) بەقسە و (عملا) بەکردار و بەسەرجەم مەرجەکانیەوە، بەڵام گەر من پەنا بە الله ڕۆژانە هەزار جار بڵێم (لا إله إلا الله) لەو لاشەوە شوێن بەرنامەیەکی غەیری ئیسلام بکەوم و خۆم بێ بەری نەکردبێت لە هەموو سنوور بەزێنێک واتە (طاغوتێك) بەهەموو جۆرەکانیەوە. جا چی کەسێک بێت یان (جن) بێت یان جگە لەحوکمی الله بێت. ئەوا هەرگیز ئەم (لا إله

إلا الله)یە سودم پێ ناگەیەنێت، چونکە (قولا) واتە بەقسە وا دەڵێم، بەڵام (عملا) واتە کردەوەم پێچەوانەیەتی.

وەک الله تعالى دەفەرموێت: ﴿قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ٨٤﴾[١].

لەم ئایەتەدا خوای خاوەن عەرش فەرمان بە ڕەسولەکەی دەکات بڵێت (لا إله إلا الله) بڵێ ئیمانم هێناوە بە الله و سەرجەم پەیامبەرانی پێشووتر، ئەمەیە عەقیدە، (الإمان بالله وحده). هەروەها لەئایەتی دواتردا واتە لەهەمان سورەت دوای فەرمانکردن بە (لا اله الا الله) ڕاستەوخۆ هەڕەشەی ئەوە دەکات.

قال الله تعالى: ﴿وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ٨٥﴾[٢].

بەڵێ ڕاستەوخۆ پێمان دەفەرموێت هەریەک جگە لەبەرنامەکەی الله قبوڵ بێت واتە ڕازی بێت بە حوکمێک جگە

١ سورة آل عمران: ٨٤

٢ سورة آل عمران: ٨٥

لەحوكمی الله وەک دیمۆکراسی، سەرمایداری، عیلمانی یان شەرعێک جگە لە شەرعی الله تعالی بێت واتە یاسای (طواغیت)بێت وەک فیرعەون کە دەیووت: ﴿مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ٢٩﴾ سەیربکەن خۆی کردووەتە ڕێگای ڕاست و تەواو جگە لە ئەو هەموو پووچە بەقسەی خۆی. بۆیە ئەمەیە پووچەڵبوونەوەی نامەی کردەوەکان هەموو یان گەر سەد ساڵ بڵێم (لا إله إلا الله)، بەڵام شەریکی بۆ پەیدا بکەم واتە بڕوام بە الله هەیە، بەڵام پێتوابێت خوایەکی تر هەیە یان داوای ڕزق و ڕۆزی جگە لە الله بکەیت یان هانا و هاوار بۆ جگە لە الله بەریت. چۆن؟ الله بۆمان ڕووندەکاتەوە لەم بارەوە، قال الله تعالی: ﴿وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ﴾[١].

دەبینیت پێیانوایە ئەمانە دەبنە شەفاعەت کاریان واتە ئەم موشریکانە کاتێک قەبرێک دەپەرستن یان بتێک یان دارێک، پێیانوایە دەبێتە شەفاعەتکار لای کێ؟ دەڵێن (عند الله) کەواتە دەزانن الله هەیە، بەڵام هاوبەشی بۆ بڕیاردەدەن.

١ سورة يونس: ١٨

بۆیە چاک بزانن "أبو الحكم" واتە "ئەبوجهل" فیرعەونی ئەم ئوممەتە مەشهورە، بەڵام بڕوای بە الله هەبووە ڕۆژووی دەگرت، حەجی دەکرد خزمەتی حاجیانی دەکرد. ئەمە حەقە و تەواوە، بەڵام بڕوای بە "هوبەل" و "لات" و "منات" و "عزاو" ئەم شتانە هەبوو. دەبینین لە جەنگی (ئوحود) "ئەباجهل" دەست بەرزدەکاتەوەو داوا لەخوا دەکات. کێمان حەقین ئەوەمان سەر بخە؟! ئەمە نیشانەی پرسیارە، دەبینین الله ئەم ڕاستییەمان لە قورئان بۆ دووپات دەکاتەوە قال الله تعالی: ﴿وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَسَخَّرَ الشَّمْسَ وَالْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ اللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾﴾[١].

ئەوان بڕوایان بەوە هەبووە الله ئاسمان و زەوی دروست کردووە و بڕوایان بەوەش هەبووە خۆر و مانگ تەنیا لەلایەن الله تعالی و موسەخەر کراون.

لەکۆتاییدا هەریەک لەم بناغانەمان تەواو نەبێت. قال الله تعالی: ﴿وَقَدِمْنَا إِلَىٰ مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاءً مَّنثُورًا ﴿٢٣﴾﴾[٢].

واتە هەرچی کردەوەی چاکە لە ڕۆژی قیامەت وەک تۆزی بابردووی لێدێت هیچی وەرناگیرێت، پوچەڵ دەبێتەوە. بۆیە قال

١ سورة العنكبوت: ٦١

٢ سورة الفرقان: ٢٣

رسول الله ﷺ ، ئەم فەرموودانە لە صحیحینن واتە "بخاری" و "مسلم": (من مات لایشرك بالله شیئا دخل الجنه). وقال: (من مات وهو یعلم إن لا اله الا الله دخل الجنه. قولن وعملا)؟ وقال: (**إن حرم النار من قال لا اله الا الله یبتغی بها وجه الله**)؟ وقال: (من لقی الله یشرك بالله شیئا دخل النار)؟ وقال: (أتانی جبریل علیه سلام، یبشرنی أنه من مات من أمتك لایشرك بالله شیئا دخل الجنه،قال أذر رضی الله عنه قلت، وان ذنی وان سرق قال وان زنی وان سرق).

**والحمد لله رب العالمین..**